دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ

SPIREZ PRESS & PUBLISHER

خودانێ ئمتیازێ : حافظ قاضی

سەرنڤیسەر : مؤید طیب

هژمارا کتێبێ : 31

ناڤێ کتێبێ : 7 کەڵەشێر

نڤیسین : ژاک لاکاری یر

وەرگێران ژ فارسی :

بۆ کرمانجیا ژێری : نەجیبە ئەحمەد

بۆ کرمانجیا ژۆری : زوبەیدا سەید سالح

پێداچوونا زمانی : موئەیەد تەیب ( کرمانجیا ژۆری )

نیگار : نەجمەددین بیری

تیپچنین : شێرزاد محمد عمر

دەرهێنانا هونەری : نزار رشاد

سەرپەرشتکارێ چاپێ : زاگروس محمود

ژمارا سپاردنێ : ( ) 2003

چاپخانە : وەزارەتا پەروەردێ ـ هەولێر

تیراژ : (1000) دانە

چاپا ئێکێ



کوردستانا عیراقێ ـ دهوك

ئاڤاهیێ سەندیکا کرێکارێن کوردستانێ ـ قاتێ سێیەم

تەلەفون 7225376 www.spirez.com

# ٧

# گەلەشێر

نڤیسین

ژاك لاكاری یر

وەرگێران

نەجیبە ئەحمەد (کرمانجیا ژێری)

زوبەیدا سالح (کرمانجیا ژۆری)

پێداچوونا زمانی

موئەیەد تەیب (کرمانجیا ژۆری)

نیگار

نەجمەددین بیری

دهــوك 2003

سپیریز

ل سەر کۆپێ چیایەکی، ل گوندەکێ جوان، حەفت دیکل هەبوون. حەفت دیکلێن حەفت رەنگ. رەنگێ هەر ئێکی وەکی رەنگەك ژ رەنگێن کەسکوسۆری بوو.
دگەل ئەلندا هەر رۆژەکێ، ئێك ژ وان دیکلان بانگ ددا و ب بانگێ وی، ئەسمانێ گوندی رەنگێ پەرێن وی دگرت.

لەسەر لوتکەی کێوێك، لە دێیەکی جواندا، حەوت کەڵەشێر ئەژیان. حەوت کەڵەشێری حەوت رەنگ، رەنگی هەر یەکێکیان وەکو رەنگێك لە رەنگەکانی پەلکە زێرینە بوو.
بەرەبەیانی هەر رۆژێك یەکێ لە کەڵەشێرەکان ئەیقوقاند و بە ئاوازی خوێندنەکەی ئاسمانی گوندی وا لێئەکرد کە رەنگی پەرەکانی کەڵەشێرەکەی لێبنیشێ.

رۆژا ئێکێ ژ حەفتیێ، ئانکو شەمبیێ، گەرا دیکلێ ئێکێ بوو. لەشێ دیکلێ ئێکێ ژ پورکا سەرێ وی هەتا دویماهیا کوریا وی وەسا یێ سۆر بوو کو هەمیا گازی دکرێ "قیقیێ نیسانۆك". دەما قیقیێ نیسانۆك بانگ ددا، هەتاڤ وەسا دشاریا کو ئەسمان تێکدا سۆر دبوو و پاشی ئەو سۆراتی ژ ئەسمانی دادکەتە ناڤ مالێن گوندی.

یەکەمین رۆژی حەفتە، واتە شەممە نۆرەی کەڵەشێری یەکەم بوو. لەش لاری ئەم کەڵەشێرە لە پۆپنەکەیەوە بیگرە تا وەکو کلکی ئەوەندە سوور بوو کە هەموو پێیان ئەوت ))قوقولی گوڵاڵە((، کاتێ قوقولی گوڵاڵە دەستی بە خوێندن ئەکرد، هەتاو ئەوەندە گەرم دائەهات کە تێکرای ئاسمان سوور هەئەگەڕا و سوورایەکەی لەو بەرزاییەوە ئەرژایە ناو ماڵەکان.

رۆژا دووێ ژ حەفتیێ، ئانكو ئێكشەمبێ، دیكلێ دووێ بانگ ددا. لەشێ وی هەمی یێ پرتەقالی بوو. ژ بەر هندێ دگوتنێ "قیقیێ پرتەقالی". دەما وی بانگ ددا، ئەسمان وەكی سندۆقەكا تژی دوڕ و گەوهەر دتەیسی.
چیا و لوتكە و گەلیێن گوندی هەمی وەكی گولچیچەكەكا زەرا باڤ پرتەقالی لێ دهاتن.

رۆژی دووەم یانی یەك شەممە، دووەم كەڵەشێر ئەیقوقاند. ئەمیان سەرتاپای نارنجی بوو. بۆیە پێیان ئەوت )) قوقولی نارنج((. كە ئەیخوێند ئاسمان وەكو سنوقێكی پڕ لە گەوهەر ئەدرەوشایەوە. شاخ و لوتكە و دۆڵی گوندەكە وەكو گولیلكە زەردە نارنجی ئەبوون.

رۆژا دوشەمبێ کو رۆژا سیێ ژ حەفتیێ یە، دۆرا دیکلێ سیێ بوو کو بهێت و بانگ بدەت. رەنگێ وی وەسا یێ زەر بوو یا ژ هەمیا ڤە ئەو کناری یە و هەمیا ژی دگۆت: "سەیرە، بۆچی ئەڤ کناری یە وەکی کناریێت دی ئاوازا ناخوینیت؟" ناڤێ دیکلێ سیێ "قیقیێ پەرزێرین" بوو. دەما بانگ ددا، ئەسمانێ گوندی رەنگێ هنگڤینی دگرت و تیرۆژکێن زەر ل هەمی رەخان بەلاڤ دبوون لێ مشکێن کۆرە خۆ ب سەرڤە نەدبر و د خەو دا دمان.

دوو شەممە سێیەمین رۆژی حەفتە، نۆرەی کەڵەشێری سێیەم بوو کە بێت و بقوقێنێ. ئەو رەنگی زەرد یوو، ئەوەندە زەرد بوو کە هەموو وایان ئەزانی کەنارییە و بەیەکیان ئەوت: " چەند سەیرە! ئەم کەنارییە بۆچی وەکو کەناریەکانی تر ناخوێنێ؟"

ناوی کەڵەشێری سێیەم )) قوقولی پەڕزێرین(( بوو. کاتێ ئەیقوقاند ئاسمان رەنگی هەنگوینی ئەبوو و نورێکی زەرد بە هەموو لایەکدا بڵاوئەبوەوە، بەڵام مشکە کوێرەکان خۆیان لێ کەڕ ئەکرد و هەروا ئەخەوتن.

سێ شەمبێ، کو رۆژا چارێ یە ژ حەفتیێ. دگەل ئەلندێ، دیکلێ چارێ، ئەوێ ب "قیقیێ کەسکێن" هاتبوو ناڤ کرن، دهات و بانگ ددا.
ئاسمان وەکی زومرودەکێ دچرسی و بەری رۆژ بهەلێت ئەسمانێ گوندی تژی رۆناهیەکا کەسك دبوو.

سێ شەممە، چوارەمین رۆژی حەفتە بوو. بەرەبەیان کەڵەشێری چوارەم کە بە قوقولی سەوزە بانگیان ئەکرد. ئەهات و دەستی بەخوێندن ئەکرد.
ئەوسا ئاسمان وەکو زومرود بریسك و هۆر ئەدەروشایەوە،
بەر لەوەی خۆر دەرکەوتایە هەوای گوند پڕ ئەبوو لە نورێکی سەوز.

چارشەمبێ، ئانکو رۆژا پێنجێ ژ حەفتیێ، دگەل بەربانگێ سبێ "قیقیێ سەدەڤ" دیار دبوو. ئەو دیکلێ پێنجێ یێ گوندی بوو و ب بانگێ خو گوند تێکدا شین دکر. دناڤ پەڕێن وی دا هەمی جۆرێن رەنگێ شین هەبوون، شینێ تاری شینێ ئەسمانی، نیلی و شینێ فەیرۆزی.
ب دیتنا پەرێن وی بیرا مرۆڤی ل ئاڤا دەریایێ دهات.

چوارشەممە یانی رۆژی پێنجەمی حەفتە، لەگەڵ بەرەبەیاندا قوقولی سەدەف پەیدا ئەبوو کە پێنجەمین کەڵەشێری گوند بوو، بە ئاوازەکانی تێکرای گوند شینی ئەنواند. لە پەرەکانیدا هەموو جۆرە شینییەك ئەبینرا: شینی تێر، شینی ئاسمانی، نیلی و پیرۆزەیی.
مرۆڤ کە پەڕەشینەکانی ئەوی ئەدی دەریا شینەکانی بیر ئەکەوتەوە.

دیكلێ شەشێ، رۆژا شەشێ یا حەفتیێ، ئانكو پێنجشەمبێ دهات و ب بانگێ خۆ هەمی ژ خەو هشیار دكرن. بەربانگێ پێنجشەمبیا هەمی دەما یێ نیلی بوو وەكی پەرێن قیقیێ رەنگ نیلی و ب رەنگێ نیلی هەمی جه نیلی دبوون و وێنێ نیلیێ ئەسمانی ژ بلنداهیێ دا دكەتە سەر بانێ مالێن گوندی و ئەسمانی ژی بەرێ خۆ ددا خۆ.

كەڵەشێری شەشەم، شەشەم رۆژی حەفتە واتە پێنج شەممە ئەهات و بەئاوازەكانی هەمووانی خەبەر ئەكردەوە، بەرەبەیانی پێنج شەممانە هەمیشە نیلی بوو، هەر وەكو پەڕە نیلیەكانی قوقولی نیلی كە رەنگی نیلی بوو، یانی ئاوییەكی تۆخ.
هەموو جێیەك نیلی ئەبوو. وێنەی نیلی ئاسمان لەو بەرزاییەوە ئەكەوتە ناو ماڵەكانی گوندەكەوە و ئاسمانیش سەیری خۆی ئەكرد.

ئەینیێ، رۆژا حەفتێ ژ حەفتیێ یە، رۆژا بهێنڤەدانێ بوو.
لێ دیکلێ حەفتی هەر کارێ خۆ دکر. دگەل بەربانگا سبێ دا ب سەر پەرژانەکێ کەڤیت و بانگ دەت.
ژ پورکا سەرێ هەتا دویماهیا کوریێ یێ بنەفشی بوو.
دەما بانگێ وی ل کۆلانان دەنگ ڤەددا، ئەرد و ئەسمان بنەفشی دبوو.

هەینی، حەوتەمین رۆژی حەفتە هەموو بێ کاربوون.
بەڵام کەڵەشێری حەوتەم کاری ئەکرد. لەگەڵ بەرەبەیاندا ئەفڕییە سەر پەرژینێك و ئەیقوقاند، لە پۆپەنەکەیەوە تا پەڕەکانی کلکی وەنەوشەیی بوو.
هەموو پێیان ئەوت )) قوقولی وەنەوشە((. کە ئاوازەکانی بە کۆڵانەکاندا بڵاو ئەبوەوە، ئاسمان و زەوی وەنەوشەیی ئەبوو.

ئو هۆسا هەمی رۆژ و رۆژێن دی، هەمی حەفتی و حەفتیێن دی، ئەو حەفت دیکل ب دۆر دهاتن و بانگ ددان و ئەسمان و بایێ گوندی ژی هەردەم...

- شەمبیا یێ سۆر بوو.
- ئێك شەمبیا یێ پرتەقالی بوو.
- دوشەمبیا زەرێ کناری بوو.
- سێ شەمبیا کەسکێ زومرودی بوو.
- چارشەمبیا یێ شین بوو.
- پێنجشەمبیا یێ نیلی بوو.

و ئەینیا ژی دا بێژی کراسەکێ بنەفشیێ کریە بەر خۆ.

ئیتر رۆژگەل و حەفتەگەل کەڵەشێری گوند بە نۆرە ئەهاتن ئەیانقوقاند.

ئاسمان و هەوای گوندیش هەمیشە،

- شەممانە سوور بوو
- یەك شەممانە نارنجی
- دووشەممانە زەردی کەناری ئاسا
- سێ شەممانە سەوزی زومرودی
- چوارشەممانە شین
- پێنج شەممانە نیلی و

هەینیش ئەتوت دەستێ جلی وەنەوشەیی لە بەرئەکات.

هەر رۆژەکا حەفتیێ، ئەسمانی یەك رەنگ هەبوو.
رەنگێ وی دیکلی پێ بانگ ددا. هەتا دویماهیێ هەمی ژ دیتنا رەنگەکێ ب تەنی بێزار بووین.
لەوا هەر حەفت دیکلێن گوندی بریاردا کو رەنگەکێ نوی دروست بکەن.
هەمی رێککەفتن کو سپێدەیەکێ هەر حەفت ب پێکڤە بانگ بدەن.
دگەل ئەلندا رۆژا ئەینی هەر حەفت دیکلاب پێکڤە بانگ دا. هەر حەفت رەنگ بوونە ئێك رەنگ و ژ نشکا ڤە رەنگێ سپی ل هەمی جها بەلاڤ بوو و ژ هینگێ وەرە ئەسمان هەردەم دگەل ئەلندا هەر رۆژەکێ سپی دبیت.

هەر رۆژێك لە رۆژەکانی حەفتە ئاسمان رەنگێك بوو، رەنگی ئەو کەڵەشێرەی کە ئەیقوقاند. تا لە دواییدا هەموویان بێزار بوون لەوەی هەریەك رەنگ ئەبینن.
بۆیە حەوت کەڵەشێرەی گوند بڕیاریان دا کە رەنگێکی تازە دروست بکەن.
لەسەر ئەوە رێککەوتن کە بەرە بەیانێك بە کۆمەڵ ئاوازێك بخوێنن.
بەرەبەیانی رۆژی هەینی هەر حەوت کەڵەشێرە دەستیان بە ئاواز خوێندن کرد.
هەر حەوت رەنگەکە بوون بەیەك و لەپڕدا رەنگی سپی هەموو لایەکی گرتەوە.
لەوە و بەدواوە ئیتر بەرەبەیانان ئاسمان رەنگی هەر سپی ئەبێ.

